**خاکەکانی ئەفغانستان دژ بە هیچ یەکێك بەکاربهێنن، لەپێناو بوژاندنەوەی گەل دەیەوێت هاریکاری بکات لە هەموو بوارەکان لەگەڵ دەوڵەتانی جیهان بە دەوڵەتانی دراوسێشەوە، وە پێشوازی دەکات لە هەموو نێوەندگیرییە دڵسۆزەکان لە لایەن هەر کەسێکەوە بکرێت لە پێناو سەقامگیربوونی ئاشتی لە ئەفغانستان"**
[متن البیان الذي تلي من قبل وفد المکتب السیاسي لإمارة أفغانستان فی مؤتمر باجواش البحثي].

## -هەڵوێستیان سەبارەت بە تاغوتە زیندانیکراوەکەی میصر (محمد مورسی)-

"ئیمارەت" دەڵێت:

"لیژنەی باڵای هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە میصر دوو ڕۆژ لەمەوبەر، سەرکەوتنی دکتۆر محمد مورسی ڕاگەیاند لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لەسەر پۆستی سەرۆکی کۆماری، **کە بە یەکەم سەرۆکی هەڵبژێردراو بە ویستی گەل لە قەڵەم دەدرێت**، وە بەهۆی ئەوەی میصر ڕۆڵێکی میحوەری هەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، **وە هەڵبژاردنی پاڵێوراوی ئیخوان موسلیمین دکتۆر محمد مورسی بە ویست و خواستی گەلی ئەم دەوڵەتە ئیسلامییە، بە گۆڕانکارییەکی گەورە لە قەڵەم دەدرێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو جیهانی ئیسلامی، بەجۆرێك ئومێدی ڕوودانی گۆڕانکارییەکی ئەرێنی بەسوودی لێ دەکرێت بۆ هەموو ئوممەتی ئیسلامی**. وە سەرکەوتنی پاڵێوراوی ئیسلامی لە سەرۆکایەتی میصر بە بەهێزترین گورز لەسەر پیلانە فراوانکردنەکەی جوولەکە و ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە هەموو جیهان هەژمار دەکرێت، **وە داوا لە الله عز وجل دەکەین گەلی موسڵمانی میصر و سەرۆکە ئیسلامییە هەڵبژێردراوەکەی سەرکەوتوو بکات**، وە ئومێدمان وایە ئەم دەرفەتە گرنگە بقۆزنەوە، و سوود وەربگرن لەم سەرکەوتنە مێژووییە بۆ بەرگری کردن لە ئوممەتی ئیسلامی و بەدیهێنانی بەرژەوەندیە ئیسلامییەکان. **ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی پیرۆزبایی دەکات لە گەلی میصری هاوسێ و سەرۆکە هەڵبژێردراوەکەی دکتۆر محمد مورسی بەبۆنەی ئەم سەرکەوتنە ئاشکرایە، وە جوانترین ئاوات دەخوازێت بۆ ئەم بۆنە پیرۆزە. وە سەرکردایەتی باڵا لە ئیمارەتی ئیسلامی داوا لە الله تعالی دەکات کە سەرکردایەتی ئیسلامی نوێی میصری سەرکەوتوو بکات بۆ خزمەتکردنی گەلەکەی**، و لە بەرگری کردن لە قەزیە ئیسلامییەکان لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی" [بیان الإمارة حول فوز مرشح إخوان المسلمین الدکتور محمد مرسي فی الانتخابات الرئاسیة بمصر].

"ئیمارەت" دەڵێت:

"سوپای میصری لە سێی مانگی یولیوی ئێستا هەڵسا بە دوورخستنەوەی سەرۆکی هەڵبژێردراو دکتۆر محمد مورسی لەڕێی کودەتایەکی سەربازی کە بە هاندانی لایەنە بیانییەکان بوو، بەوەندەش نەوەستان کە ڕێزی یاسا و ویستی گەلی میصرییان نەگرت، بەڵکو ژمارەیەك لە ئەندامانی **حکومەتە شەرعییەکە** و کەسایەتییە ئیسلامییەکانیان دەستگیرکرد، [...] بەڵام! لەبری ئەوەی سوپا بچێتە پاڵ **حکومەتە شەرعییەکە** و سەرۆکی هەڵبژێردراو، و کۆتایی بهێنێت بە وروژێنەرانی ئاژاوە و فیتنە، چووە پاڵ عەلمانییەکان و لیبراڵییەکان دژ بە **حکومەتی شەرعی** و سەرۆکی هەڵبژێردراو! [...] وە بۆ ئەوەی ئەم مەینەتیەی ئێستا کۆتایی پێبێت لە میصر، **پێویستە سەرۆکی هەڵبژێردراو دکتۆر محمد مورسی بە زوویی بگەڕێتەوە، وە دەسەڵاتە یاسایی و شەرعییەکەی بۆ بگەڕێنرێتەوە**، وە سەرکردە و ئەندامەکانی حیزبە ئیسلامییەکان ئازاد بکرێن، و دووربکەونەوە لە گرتن و ڕاوەدونانی ئەوانەی ماون؛ چونکە ئەم کارە دزێو و ناشرینانە چارەنووسێکی خراپ و زیانبەخشی گەورەی هەیە نەك تەنها ئایندەی میصر و گەلەکەی دوچاری مەترسی و بەفیڕۆچوون دەبنەوە، **بەڵکو شوێنەوارێکی نەرێنی دەبێت لەسەر وڵاتەکەمان بەتایبەت، و لەسەر دەوڵەتانی ئیسلامی بە گشتی، جا خەڵکی ناچار دەبن وڵاتەکانیان جێبهێڵن، بەمەش ناوچەکە و جیهان بە ئاڕاستەی فەساد و تێکچوون و نەمانی ئاسایش دەچێت**" [الشعب المصري ومأساة الديمقراطية].

"ئیمارەت" دەڵێت:

"بەوپەڕی دڵتەنگی و خەمبارییەوە دەڵێین بەیانی ڕۆژی چوارشەممە، حەوتی مانگی شەوالی ساڵی ١٤٣٤ هـ، سوپای میصری و سەربازانی ئاسایش و پۆلیس هەڵسان بە بڵاوەپێکردنی دوو گەورەترین خۆپیشاندان، کە بۆ ماوەی نزیکەی دوو مانگ بەردەوام بوو، لە لایەن پشتیوانە ئاشتیخوازەکانی سەرۆکی هەڵبژێردراو محمد مورسی کە ڕەتکەرەوە و ناڕازی بوون بەرامبەر کوتادە سەربازییەکە، بە هێزی چەك و گازی فرمێسك ڕژێن لە شاری قاهیرە پایتەختی میصر! [...] بەڕاستی ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی لە کاتێکدا کە ئیدانەی ئەم تاوانە قێزەون و نائەخلاقی و نائینسانییە دەکات بە توندوتیژترین دەستەواژە، داوا لە سوپا و پۆلیس لە میصر دەکات بەوەی دەستهەڵبگرن لە ڕشتنی خوێنی بێتاوانەکان و ستەملێکراوان لە منداڵان و ئافرەتان و گەنجان و پیرەکان، وە بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بەرەو خراپتر و ئاڵۆزتر نەڕوات، **دەبێت ڕێگە خۆش بکرێت بۆ گەڕانەوەی سەرۆکی شەرعی هەڵبژێردراو بۆ سەر کورسی دەسەڵات**" [بيان إمارة أفغانستان حول المجازر المستمرة في مصر].

وتەبێژی فەرمی "ئیمارەت" دەڵێت:

"بەڕاستی ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی کودەتاکە بەسەر نوێنەری گروپ و لایەنە ئیسلامییەکان لە میسرـ و سەرۆکی هەڵبژێردراو محمد مورسی، وە لابردنی بە زەبر لە کورسی دەسەڵات، و کوشتنی بەرهەڵستکارە ئیسلامییەکان و دەستگیرکردنیان، بە سەرپێچی هەموو یاساکان، و دەستدرێژی کردنە سەر مافەکان لە قەڵەم دەدات، **وە گەلی میسری هاوسێ بانگ دەکات بۆ ئەوەی لەژێر ڕۆشنایی بنەماکانی ئیسلامی خۆیان جوان بکەن بە دان بەخۆداگرتن و ئارامگرتن و دانایی و چاوساغی**، وە بەشێوەیەکی تایبەت پێداگرین لەسەر پێویستییێتی یەکگرتنی حیزبە ئیسلامییەکان، وە ڕێگە نەدەن بە زیادبوونی ئاگری ناکۆکی و دووبەرەکی و ئاژاوە لەناو گەل، **هەروەك ئیمارەتی ئیسلامی بانگەوازی هەموو جیهان، و دەوڵەتانی ئیسلامی، و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، و کۆنگرەی ئیسلامی و تەواوی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دەکات کە بەپێی یاسا بچنە پاڵ ویستی گەلی میسری و داواکارییەکانی**، وە ڕاپەڕن بۆ سەرخستنی ستەملێکراوان، و بە ڕووی توندوتیژی و ستەم بوەستنەوە، وە هەنگاوی پێویست بگرنەبەر بۆ لەناوبردن و کۆتایی پێهێنانیان" [تصريحات الناطق باسم الإمارة حول الأوضاع الأخيرة في جمهورية مصر العربية].

"ئیمارەت" دەڵێت:

"ڕۆژی پێنج شەممەی ڕابردوو ٢٠١٥/٥/١٦ دادگای ڕژێمی کودەتاچی لە میسرـ حوکمێکی زۆردارانەی دا بەوەی دەبێت **دکتۆر محمد مورسی سەرۆکی شەرعی میسر** و کۆمەڵێك لە ئەندامانی بزوتنەوەی حەماس و ژمارەیەك لە سەرکردە گرنگەکان لە ڕێکخراوی ئیخوان موسلیمین لە سێدارە بدرێن. ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی لەکاتێکدا کە ئیدانەی ئەم حوکمە زۆردارە دەکات بە توندترین دەستەواژەکان و ڕەتی دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا **داوا لە هەموو کۆمەڵە نێودەوڵەتی و هەرێمیەکانی مافی ئینسان، و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات، وە بەتایبەتیش دەوڵەتانی ئیسلامی و ڕێکخراوی هاریکاری ئیسلامی، و هەروەها کەسایەتیە کاریگەرەکان لە جیهانی ئیسلامی، کە بەپێی سۆز و بەزەیی ئینسانی و برایەتی ئیسلامی هەڵسن بە بەرپرسیاریەتیە ئینسانی و ئیسلامییەکەیان** بۆ ڕاگرتنی جێبەجێکردنی ئەم حوکمە ستەمکاریە، وە ڕێگە نەدەن ڕژێمی کودەتاچی لە میسر هەڵسێت بە نموونەی ئەم کارە خۆویستیە نائینسانی و نائەخلاقییانە" [بيان الإمارة حول إصدار حكم إعدام **الرئيس الشرعي لمصر** الدكتور محمد مرسي].

## -هەڵوێستیان دەربارەی تاغوتی قەتەڕ-

"ئیبارەت" دەڵێت:

"**هەروەك بەم بۆنەیەوە سوپاسی شکۆدار و پایەبەرز ئەمیری دەوڵەتی قەتەڕ (الشیخ تمیم بن حمد بن خلیفة آل ثاني) دەکەین، کە هەوڵ و تێکۆشانی دڵسۆزی داوە، و ڕۆڵێکی نێوەندگیری سەرکەوتووی هەبووە،** لە پێناو ڕزگارکردنی سەرکردە ناوبراوەکان و مێوانداری **کردنیان، داوا لە الله دەکەم جێگرەوەیەکی چاکی بۆ دابنێت لە دونیا و پاداشتی گەورەی بداتەوە لە دوارۆژدا.** هەروەها داوا لە الله تعالى دەکەم هەموو زیندانیە هاونیشتیمانیە ستەملێکراوەکان وەك ئەم سەرکردانە ئازاد بکات، کە بەندکراون **لە پێناو ڕزگارکردنی نیشتیمان،** و خزمەتکردنی دین" [رسالة تنهئة حول إفراج القادة الجهاديين من معتقل غوانتانامو].

"ئیبارەت" دەڵێت:

"وە شایانی باسە، **ئێمە سوپاسی دەوڵەتی قەتەڕی هاوسێ دەکەین و ئەمیرە پایەبەرزەکەی (الشیخ حمد بن خلیفة آل ثاني) -الله بیپارێزێت- بەبۆنەی ئەوەی پەسەندی کرد نووسینگەیەکی سیاسی بۆ ئیمارەتی ئیسلامی بکرێتەوە لە وڵاتەکەی،** وە ئاسانکاری پەیوەست بەمەی دابین کرد" [بيان حول افتتاح مكتب سياسي لإمارة أفغانستان في دولة قطر].

## -بانگەوازکردن بۆ تاغوتەکان "دەسەڵاتدارانی موسڵمانان-!"

"ئیبارەت" دەڵێت:

"ماوەی چەند ڕۆژێکە دەستدرێژییێکی دڕندانەی ستەمکار لە لایەن هێزەکانی تایبەتی داگیرکاری جوولەکە لەسەر مزگەوتی ئەقسا و مزگەوتی (القبلي خاصة) دەکرێت، [...] لە کاتێکدا کە ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی بە توندترین شێواز ئەم تاوانەی سەهیۆنی ئیدانە دەکات، **داواش دەکات لە هەموو حکومەتەکانی جیهانی ئیسلامی، و ڕێکخراوی هاریکاری ئیسلامی،** و ڕێکخراوی جیهانی زانایانی موسڵمانان، و هەموو مەرجەعە فیقهییەکان لە هەموو ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی کە هەڵسن بە بەرپرسیارێتیان بەرامبەر مزگەوتی ئەقسا دژ بە دەستدرێژییەکانی جوولەکە ئیسرائیلیە دڕندەکان، وە قەدەغەکردنی ئەم دەستدرێژیانە لە ڕێگەی فشارە دبلۆماسیەکان. [...] **ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی داوا لە هەموو سەرۆکەکانی موسڵمانانی ئەم دەوڵەتانە دەکات بچنە پاڵ هاوپەیمانیەتیێکی ئیسلامی**" [بيان إمارة أفغانستان حول اعتداء الاحتلال الصهيوني على المسجد الأقصى].

# -پەیوەندی بەستنی دوولایەنە لەگەڵ ئێرانی ڕافیضی-

"ئیمارەت" دەڵێت:

"ڕۆژنامەی فارس ـی ئێرانی هەواڵێکی بڵاوکردووەتەوە دەربارەی شاندی ئیمارەتی ئیسلامی بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران، **وە ئیمارەتی ئیسلامی جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە و پشتگیری دەکات**. ماوەیەك بەر لە ئێستا، شاندێك بە سەرکردایەتی نووسینگەی سیاسی ئیمارەتی ئیسلامی هەڵسا بە سەردانیکردنێك بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بۆ شاری تارانی پایتەختی ئێران، **وە سەردانەکە ئەنجامدرا بۆ موناقەشەکردنی پەیوەندییە دووانییەکان لەنێوان هەردوولا**، وە شاندەکە گەڕایەوە دوای موناقەشەکردنی بابەتە باسکراوەکان لە پێشدا. [...] **ئەم سەردانە بە داوایەکی فەرمی حکومەتی ئێرانی ئەنجامدرا، کە لەم ماوەیدا شاندی ئیمارەتی ئیسلامی توانی دەنگی گەل** و موجاهیدان و داواکارییەکانیان بگەیەنێت بۆ گوێچکەی شاندەکانی دەوڵەتە جیا جیاکانی جیهان، وە زانیارییەکانی پێڕاگەیاندن دەربارەی ڕەوشە بەردەوامەکان، **هەروەك هەڵسان بە گفتوگۆکردنی ئەرێنی لەگەڵ گەورە بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی ئێران سەبارەت بە بابەتانێکی جۆراوجۆر. [...] وە لەسەرمان پێویستە بڵێین کە ئیمارەتی ئیسلامی هەمیشە هەوڵیداوە بۆ سەرپەرشتی کردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچەکە و جیهان، لە چوارچێوەی ڕێزگرتنی بەرامبەر، وە دانەبڕاوە دوای هەوڵەکانی لەم ڕێگایەدا**" [تصريحات القاري محمد يوسف أحمدي حول سفر وفد الإمارة إلى جمهورية إيران].

وتەبێژی "ئیمارەت" دەڵێت:

"بەم دواییە شاندێکی باڵا لە ئیمارەتی ئیسلامی بە سەرکردایەتی بەڕێز محمد طيب آغا سەرۆکی نووسینگەی سیاسی ئیمارەتی ئیسلامی **سەردانی دەوڵەتی ئێرانی هاوسێی کرد**، شاندی ئیمارەتی ئیسلامی لەم ماوەیەدا لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکان تاوتوێی بارودۆخی ئێستای ئەفغانستان، و ناوچەکە و جیهانی ئیسلامی و ڕەوشی موهاجیرە ئەفغانییەکانیان کرد کە لە ئێران نیشتەجێن. شایانی باسە کە ئەم گەشتە بەشێکە لە گەشتە ئاساییەکانی شاندی ئیمارەتی ئیسلامی ئەنجامیان دەدات لە کاتێك بۆ کاتێکی تر بۆ دەوڵەتە جیاوازەکان لە جیهان **لە پێناو تاوتوێ کردنی بابەتانێکی دوولایەنی، و دروستکردنی بەستەرەکان، و فراوانکردن و بەهێزکردنیان**" [تصريحات المتحدث باسم الإمارة حول سفر وفد رفيع المستوى إلى إيران].

"ئیمارەت" دەڵێت:

"لەم جیهان و لەم ڕۆژگارەدا، هەر دەوڵەتێك و هەر گەلێك و هەر کۆمەڵگەیەك پێویستی بە کەسانی تـرە لە بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی و تەواوکردنیان، وە دەوڵەتەکان بەدوای هاوبەشە نێوانییەکان دەکەون لە ڕێگەی پەیوەندیە نێوەخۆییەکان، و گەڕان بەدوای پێشکەوتنی ئابووری، و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و ئامادەکردنی ژیان و ئاسایشی گەل هەوڵدەدات بۆ دامەزراندنی پەیوەندییە دیبلۆماسیەکان لەگەڵ کەس و لایەنی تر، وە لەگەڵیدا گفتوگۆی پەیوەست بە پەیوەندییەکانی دوو دەوڵەتەکە دەکات، وە یەکێکیان یارمەتی ئەوەی تر دەدات لە کاتی پێویستی و تەنگانە، وە هەریەکێکیان لە گەڕانن بۆ دۆزینەوەی چارەسەرەکانی کێشەکانی گەلەکەی و دانیشتوانەکەی".

"جا لەم تێڕوانینەوە، **ئیمارەتی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی سیاسەتی دەرەوەی مەعقول و هاوسەنگەکەی، هەڵساوە بە دامەزراندنی پەیوەندی دیبلۆماسی بنیاتنراو لەسەر بنەماکانی ڕێزگرتنی بەرامبەر، و یەکسانی، و دەستوەرنەدان لە کاروبارە ناوەخۆییەکان لەگەڵ دەوڵەتە جیا جیاکانی ناوچەکە و جیهان، وە هەوڵدەدات بۆ فراوانکردنی سنووری پەیوەندیە سیاسییەکان، و درێژکردنەوەیان بۆ تەواوی دەوڵەتانی تر، وە پەیوەندیان لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانی ئیسلامی ئەڵقەیەکە لەم زنجیرەیە."**

"داوا و بانگهێشتکردنەکەی ئێران، وە گەشتی بەرپرسی نووسینگەی سیاسی ئیمارەتی ئیسلامی لەگەڵ شاندنی یاوەری، و دیدارە ئەرێنییەکان لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکان، هەموویان بە ڕوون و ئاشکرا شایەدە لەسەر سیاسەتی دەرەوەی مەعقول و ئاشتیخواز و سەربەخۆ و هاوسەنگی ئیمارەتی ئیسلامی، وە هاوکات **شاندەکە هەوڵیداوە بۆ باشکردنی پەیوەندیە دوو لایەنییەکان**، وە گفتوگۆی کردووە دەربارەی بابەتی موهاجیرە ئەفغانەکان و کێشەکانیان، ئەمە دەیسەلمێنێت کە ئامانجی سەرەکی و بنەڕەت لە دانانی پەیوەندییەکان لەگەڵ دەوڵەتانی جیهان بریتییە لە تەواوکردنی داواکارییەکانی گەلی ئەفغانی و ئامانجەکانی، وە بەدیهێنانی بەرژەوەندییە باڵاکان بۆ وڵاتەکە و تەئمین کرنیان بە تەنها نەوەك هیچی تر".

"**بەڕاستی ئێران دەوڵەتێکی ئیسلامییە، و سنووری هاوبەشی هەیە لەگەڵ ئەفغانستان**، وە لەوێدا زیاتر لە ملیۆنێك موهاجیری ئەفغانی نیشتەجێن، کە دەوڵەمەندە بە نەوت، و بە ئابوورییەکی باش دەگوزەرێنێت و دەژییێت، و کەناراوێکی هەیە لەگەڵ دەریا، و دەوڵەتێکی گرنگە لەسەر ئاستی ناوچەکە و جیهان، **ئەمانە بریتیین لەو ڕووانەی ئەم دوو دەوڵەتە لە یەکتر نزیك دەکاتەوە بەڵکو هەریەکەیان ناچار دەکات هەڵسوکەوت و ڕەفتاری چاك لەنێوانیان هەبێت لە چوارچێوەی بەرژەوەندیەکانی گەل و باشبوون لەگەڵ دراوسێ، وە وایان لێ دەکات پەیوەندی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریان هەبێت**".

"سیاسەتی ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی نێوەخۆیی و دەرەکی لە کرۆکی شەریعەتی ئیسلامی وەرگیراوە،

**چونکە دینی ئیسلام ئەم ڕێکخەر و بنەما و گشتییانەی ئاسوودەیی ئینسانی لەخۆگرتووە ڕوونکردۆتەوە، کە ڕێکخستنی کۆمەڵگە ئینسانییەکانی جوان کردووە، جا هەر ئەویش فەرمانی کردووە بە برایەتی و سۆز و بەزەیی و هاریکاری لەگەڵ موسڵمانان**، وە ئامۆژگاری بە دادپەروەری و دەستدرێژی نەکردنی ستەمکارانە بۆ سەر ناموسڵمانەکان کردووە، وە هان دەدات لەسەر جوان هەڵسوکەوت کردن و باشبوون لەگەڵ دراوسێ لەگەڵ هەموو نەوەی ئادەم" [السیاسیة الخارجیة للإمارة تمثل المصالح العلیا للبلد].

"ئیمارەت" دەڵێت:

لیژنەی سیاسی لە ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی بە گونجاوی دەزانێت هەڵوێستی ڕوون بکاتەوە لە کاتێك بۆ کاتێکی تر؛ بۆ ڕۆشنکردنەوەی هزری گەلانی جیهان. [...] ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی دەیەوێت پەیوەندی چاکی هەبێت لەگەڵ هەموو دەوڵەتانی جیهان و دەوڵەتانی دراوسێ، وە ئارەزوو دەکات لەگەڵیان بژیێت لە چاکسازی و ئارامی لەژێر ڕۆشنایی سیستەمە ئیسلامییە پاکەکان. هەروەك داواش لە هەموو جیهان دەکات پێکەبستنەوەی باش هەبێت. [...] **بە هەمان شێوە ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی ئیدانەی سزایە نوێیەکان دەکات لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایش لەسەر کۆماری ئیسلامی ئێران و خۆتوندکردن و پەتەوکردن لە دژی ئەم وڵاتە و گەلەکەی**، وە بە باتڵ هەژماری دەکات. وە ئیمارەتی ئیسلامی لەسەر ئەساسی هاوسۆزی لەگەڵ گەلەکان، هۆشداریە ئابوورییەکانی بەم دواییە و پێشوو لە لایەن ئەنجومەنی ئاسایش **بە تێپەڕاندنێکی گەورە و ستەمێك لە بەرامبەر ئێران و گەلەکەیدا لە قەڵەم دەدات**. بەمەش کاریگەریە خراپەکان و لایەنە نەرێنییەکانی ئەم هۆشداریانە ڕاستەوخۆ لەسەر گەلەکە دەکەوێت، داوا دەکات کە هەموو بابەتەکان چارە بکرێن و کێشەکان نەهێڵدرێن لە ڕێگەی گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن" [بیان اللجنة السیاسیة فی إمارة أفغانستان حول عدد من حوادث أفغانستان والعالم].

## -نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕژێمە نێودەوڵەتییەکان لە دوای ١١ ئەیلول-

"ئیمارەت" دەڵێت:

"ئیمارەتی ئیسلامی بڕیاریدا نووسینگەیەکی سیاسی بۆ خۆی بکاتەوە لە دەوڵەتی قەتەڕ، بۆ ڕوونکردنەوەی ستراتیجییەکەی و ئەم ئامانجانەی: [...] **درێژەپێدان بە پەیوەندیەکان لەگەڵ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، و ڕێکخراوەکانی هەرێمی و نێودەوڵەتی، و دامەزراوە ناحکومییەکان**" [بیان حول افتتاح

مكتب سياسي لإمارة أفغانستان في دولة قطر].

"ئیمارەت" دەڵێت:

بەبۆنەی ئەوەی دەوڵەتە ئەندامەکان لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەنگیان دا بە زۆرینەیەکی بـڕاوە لە بیست و نۆی مانگی نـۆڤێمبەری ئەم سـاڵ ٢٠١٢م بـۆ بەرژەوەنـدی فەڵەسـتین وەك دەوڵەتێکـی چـاودێری نائەندام لە ڕێکخراوە نێـودەوڵەتییەکە، **ئیمارەتـی ئەفغانسـتانی ئیسـلامی ئەم کـارە بە مـوژدەیەکی گەورە بـۆ ئوممەتی ئیسلامی لە قەڵەم دەدات** و بەتایبەتیش بۆ گەلی فەڵەستینی ستەملێکراو، وە بە هەنگـاوێکی گرنـگ هەژماری دەکات بۆ بەرەو سەربەخۆچوونی فەڵەستینی ستەملێکراو، ئیمارەتی ئیسلامی وەك نوێنەرێك بۆ گەلی ئەفغانی موجاهید **لە قوڵایی دڵەوە پیرۆزبایی دەکات لە گەلی فەڵەستینی** موجاهیـد و سـتەملێکراو بەبـۆنەی **ئەم دەستکەوتە گەورەیە**" [بيان الإمارة حول قبول فلسطين كدولة مراقب غير عضو في الأمم المتحدة].

"ئیمارەت" دەڵێت:

"ئیمارەتـی ئەفغانسـتانی ئیسـلامی بەتونـدترین دەسـتەواژەکان ئیـدانەی چەوسـاندنەوە و دەربەدەرکردنـی موسڵمانانی ڕۆهینگا و ئەو کۆمەڵکوژییانەی ئەنجام دەدرێت بەرامبەریان دەکـات، **وە داوا دەکـات لە نەتەوە یەکگرتووەکان، و ڕێکخراوی هاریکاری ئیسلامی،** و دەوڵەتانی ناوچەکە، **و هەمـوو دەسـتە و کۆمەڵەکـانی مافی ئینسان کە بێدەنگییان بشکێنن لە بەرامبەر ئەوەی دەگوزەرێت لە مەینەتی و کارەساتەکان لە بۆرما، وە فشـار بـخەنە سـەر حکـومەتی بۆرمـا** بـۆ وەسـتاندنی قەسـابخانە و کردارەکـانی لەنـاوبردنی موسـڵمانانی سـتەملێکراوی ڕۆهینگـا بەزوویـی و بەپەلە، وە دەسـتگیرکردنی مـوجریمە تۆمەتبارەکـان بە ئەنجامـدانی ئەم کۆمەڵکوژییانە و **دادگایی کردنیان**" [بيان الإمارة تجاه المأساة الإنسانية الجارية في بورما].

"ئیمارەت" دەڵێت:

"بەڕاستی ئیمارەتی ئیسلامی لە کاتێکدا کە ڕزگارکردنی موسڵمانە ستەملێکراوەکان لە ئەفریقیای ناوەڕاست لەم بار و ڕەوشەدا بە بەرپرسیاریەتییێکی ئەخلاقی و ئینسانی بـۆ هەمـوو جیهـان و بەرپرسـیاریەتییێکی شـەرعی و ئیمانی بـۆ ئـوممەتی ئیسـلامی لە قەڵەم دەدات، لە هەمـان کاتـدا بە تونـدترین دەسـتەواژەکان ئیـدانەی ئەوە دەکات کە میلیشیا مەسـیحییە دڕنـدەکان ئەنجـامی دەدەن لە کوشـتنی بـێ بەزەییـانە لە بەرامـبەر موسـڵمانان لەوێـدا، **وە بەشـێوەیەکی تـایبەت بـانگەوازی ڕێکخـراوی هاریکـاری ئیسـلامی، و ڕێکخـراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، و دەستەی بەرگری مافەکانی ئینسان، و یەکێتی ئەفریقیا، و سەرۆکی دینی گەورەی نەساڕا**

**لە ڤاتیکان باب فرانسیس دەکات کە هەنگاوی کرداری بگرنەبەر بۆ قەدەغەکردنی کوشتنی گشتی موسڵمانان لە ئەفریقیای ناوەڕاست، وە هەڵسن بە بەرپرسیاریەتیە ئەخلاقی و ئینسانییەکەیان لەم بارەیەوە"** [بیان الإمارة حول القتل العام لمسلمي أفريقيا الوسطى].

"ئیمارەت" دەڵێت:

"پێویستە لەسەرمان بەوپەڕی دڵتەنگییەوە بڵێین کە هێزەکانی داگیرکاری ئیسرائیلی بەردەوامە لە بۆردومانە ئاسمانیەکەی بۆ ماوەی دوو ڕۆژە لەسەر کەرتی غەززە لەم مانگە پیرۆزەدا [...] ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی لە کاتێکدا کە بەتوندترین دەستەواژە و ڕەقترین وشەکان ئیدانەی ئەم ستەم و دوژمنکاریە دەکات، **بە جدیەوە داوا دەکات لە هەموو جیهان و بەتایبەت نەتەوە یەکگرتووەکان، و کۆنگرەی ئیسلامی، و دەوڵەتانی ئیسلامی، و تەواوی ڕێکخراوەکانی ئینسانی و مافپەروەرەکان کە هەنگاوی جدی** و پێویست بگرنەبەر بۆ وەستاندنی ئەم دوژمنکاریە دڕندانەیە، وە پێویستە لەسەر هەمووان کە بە بەرپرسیاریەتیە ئینسانی و دینییەکەیان هەڵسن لە وەستاندنی ستەم و دوژمنکاری ئیسرائیلی و سەرخستن و ڕزگارکردنی گەلی غەززەی ستەملێکراو" [بیان إمارة أفغانستان تجاه الوحشية الإسرائيلية على غزة].

وتەبێژەی "ئیمارەت" دەڵێت:

"هێزە دڕندەکانی ئەمریکا و سەربازانی بەڕێوەبردنی بەکرێگیراوی کابۆل بەم دوایيە دەستیان کرد بە زنجیرەیەك لە کوشتنی مەدەنیە بێتاوانەکان و ئەشکەنجەدانیان، [...] ئێمە تاوانەکانی دوژمن و ئەم ڕەفتارە ترسنۆکانەیان ئیدانە دەکەین، وە جەخت دەکەینەوە کە نموونەی ئەم هەوڵانە ویستی گەلی ئەفغانی بەغیرەت ناشکێنێت، بەڵکو شوێنەوارێکی ئاشکرای دەبێت لە نزیکبوونەوەی کاتی شکستهێنانی دوژمن و وێرانبوونی، **وە ئێمە داوا دەکەین لە هەموو ڕێکخراوەکانی مافی ئینسان و کۆمەڵەکانی نێودەوڵەتی کە ئیدانەی تاوانەکانی دوژمن بکەن، و بەرپرسیاریەتیە ئینسانییەکەیان جێبەجێ بکەن بە ڕووی خەڵك و مەدەنییەکان"** [تصريحات الناطق باسم الإمارة حول قتل المدنيين في البلد].

# -دەستوری ئیمارەتی ئەفغانستان-

لە دەستوری "ئیمارەت"دا هاتووە:

"ماددەی ٥٣: دەبێت پێشەوای ئیمانداران پیاوێکی موسڵمان بێت و شوێنکەوتەی مەزهەبی فیقهی و حەنەفی بێت و خاوەنی ڕەگەزنامەی ئەفغانی بێت **و دەبێت لە باوك و دایکێکی بەڕەچەڵەك ئەفغانی لە دایك بووبێت.**

ماددەی ٩٨: **سیاسەتی دەرەوەی** ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی ڕێنمایە بەهێزەکانی ئیسلام دەبێت، **پێکهاتووە لەسەر ئەساسی گێڕانی ڕۆڵی کاریگەر، و ڕێکخستن و بنیاتنان بۆ تەئمین کردنی بەها ئینسانییەکان، و بەرژەوەندیە کۆمەڵایەتییەکان، و ئازادی سیاسی، و تێکڕایی زەویی، و ئاسایشی جیهانی، و هاریکاری نێودەوڵەتی.**

ماددەی ٩٩: **ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی بەرگری لە بڵاوکراوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، و ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، و بزوتنەوەی بێلایەن، و بڵاوکراوەی مافەکانی ئینسان، و جگە لەمانەش لە بنەما و بڕیاردراوە قبوڵکراوەکان دەکات**، مادام دژ نەبێت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی، و **بەرژەوەندییەکانی وڵات.**

ماددەی ١٠٠: ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی لەسەر ئەساسی ڕەچاوکردنی مافەکانی یەکتر و ڕێزگرتنی بەرامبەر لەژێر ڕۆشنایی شەریعەتی ئیسلامی، **دەیەوێت پەیوەندی باش دابنێت، و گەشەیان پێبدات و فراوانیان بکات، وە بەرەوپێش بردنی بۆنەکان لەگەڵ هەموو دەوڵەتانی جیهان و بەتایبەت ئەو دەوڵەتەی پاڵپشتی گەلی ئەفغانی ستەملێکراوی کرد لە ماوەی جیهاد لە شۆڕشە ڕەواکەیان.**

ماددەی ١٠١: **ئیمارەتی ئەفانستانی ئیسلامی بەپێی مافی دراوسێ، یارمەتی و هاریکاری زیاتری دەوێت لەنێوان دەوڵەتانی دراوسێ، وە هەوڵ و کۆشش دەکات لە بواری چەسپاندنی برایەتی ئیسلامی، و پەیوەندی جیهانی ئیسلامی، و یەکخستنی ئوممەتی موسڵمان.**

ماددەی ١٠٢: **ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامی ڕێزی مافەکانی هەموو گەلانی جیهان دەگرێت، و نکوڵی دەکات لە دەستدرێژی کردن بۆ سەر مافەکانیان، و زەوتکردنی ئازادی.**

ماددەی ١٠٣: ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی بە ئامانجی پاراستن و تەئمین کردنی مافە ئینسانییەکان بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگای ئینسانی، و لە پێناو ئازادی ئەوانە، بەرگری دەکات لە داواکارییە ڕەواکانی گەلانی حوکم کراو، وە داوا دەکات ململانێ و ناکۆکیە ناوچەییەکان چارەسەر بکرێن و نەهێڵدرێن لە ڕێگەی مەعقولی و ئاشتی لەژێر ڕۆشنایی بنەماکانی ئیسلامی، و پێوەرەکانی ویژدان، وە نکوڵی دەکات لە هەر جۆرە کارێکی فشار و هێز بەکارهێنان" [دستور إمارة أفغانستان].

## -گوتاری نەتەوەیی-

"ئیمارەت" [بەناوی مەلا عمر ـەوە] دەڵێت:

"سەبارەت بە چارەنووسی سیاسی بۆ ئایندەی ئەم وڵاتە بۆ جارێکی تر دەڵێم: "**ئێمە بیر لە قۆرغکردنی دەسەڵات ناکەینەوە، وە پێشبینی جەنگی نێوخۆیی ناکەین دوای ڕۆیشتنی داگیرکەران، بەڵکو تاکە هەوڵمان بریتییە لەوەی ئەفغانییەکان خۆیان چارەنووسی سیاسی بۆ وڵاتەکە دیاری بکەن** دوور لە دەستێوەردانەکانی دەوڵەتە زلهێزەکان لە جیهان، وە دوور لە دەستێوەردانەکانی دەوڵەتانی دراوسێ، **و ئەم چارەنووسە دەبێت خاوەنی بۆیەیەکی ئیسلامی و ئەفغانی پوخت بێت** [...] وە دوای ئازادکردنی وڵات خۆشدەگوزەرێنین بە سەرکەوتنی الله تعالی و بەهرەوەر دەبین پێیەوە بەم ڕژێمی شەرعی **و نەتەوەییەی** هەوڵدەدات بۆ دۆزینەوەی حکومەتێکی دوور لە هەموو جۆرەکانی ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری، وە کاروبارەکان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خەڵکەکەی، وە پارێزگاری دەکرێت لە **یەك پارچەیی خاکی نیشتیمان**، هەروەك ئاسایش دابین دەکرێت، و شەریعەت جێبەجێ دەکرێت، وە بەدیهێنانی مافەکانی هەموو تاکەکانی وڵات بە پیاو و ئافرەتەوە دەستەبەر دەکرێت، وە کار دەکات بۆ نۆژەنکردنەوەی ژێرخانی ئابووری وڵات، وە بە هەمان شێوە هەڵدەستێت بە بەهێزکردنی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لە وڵاتدا، وە هەڵدەستێت بە دابینکردنی ئاسانکاریە فێرکارییەکان بۆ هەموو گەل لەژێر ڕۆشنایی بنەما ئیسلامییەکان **و بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان**، وە ئەم حکومەتە کار دەکات بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری زانستی و ڕۆشنبیری لە ئاڕاستەیەکی دروست، وە بە یارمەتی گەلە سەربەرزەکەی دەبێتە بەربەستێکی ڕێگر لە ڕێگای بەدیهێنانی ئامانجە شوم هێنەکان بۆ ئەوانەی بیر لە هەڵگیرساندنی **جەنگی نێوخۆیی** و دابەشکردنی وڵات دەکەن [...] وە دەربارەی لێك تێگەیشتن لەگەڵ هێزە دەرەکییەکان دەڵێم: ئێمە بەردەوام دەبین لە شۆڕشی سیاسیمان لە پاڵ کارە سەربازییەکەمان بۆ هێنانەدی ئامانج و ئاواتە ئیسلامی **و نەتەوەییەکانمان**، وە لایەنێکی تایبەتمان داناوە لە چوارچێوەی نووسینگەی سیاسی بۆ

بەدواداچوونی ڕێڕەوە سیاسیەکە، وە نووسینگەی سیاسی لەگەڵ بیانییەکان ڕەفتار دەکات بەگوێرەی بەرژەوەندیە ئیسلامی و جیهادیەکەمان" [بيان بمناسبة عيد الأضحى المبارك ١٤٣٣ هـ.]

## -ڕێزگرتنی دینەکان-

"ئیمارەت" دەڵێت:

"**سوکایەتی و خراپەکردن بەرامبەر دینەکان و پیرۆزیە دینیەکان تاوانێکی چاوپۆشی لێنەکراوە، کە کارێکە هەموو ئینسانیەت بە تێڕوانینێکی ڕق لێبوونەوە و قێزەون سەیری دەکەن** [...] وە لەم لایەنەشدا هەموو دەوڵەتانی ئیسلامی و نائیسلامی و گەلەکان بەرپرسیاریەتیێکیان هەیە بەو سیفەتەی کە ئینسانن، **پێویستە ڕەتی بکەنەوە و ڕێگری بکەن بە جدی و توندی لە هەر کارێکی خراپ و زیانبەخش بۆ دینەکان و پیرۆزییەکانیان**، وە هەر کارێکی سوك و ڕیسواکەر بۆ خەڵك، و ناچارکەر بۆ گەلان بەوەی هەڵسن بە تۆڵەسەندەوە" [بيان الإمارة حول الإقدام المسيء في فرنسا].

## -ڕافیضە لە دیدی "ئیمارەتی" تاڵیبان-

"ئیمارەت" لە ڕاپۆرتێکی "ئەنجومەنی شوراکەی" دەربارەی چالاکییەکانی دژ بە ڕافیضەی ئەفغانستان دەڵێت:

"ڕۆژی عاشورا لە دەی مانگی موحەڕەمی ئەم ساڵی ١٤٣٣ هـ دوو تەقینەوە ڕوویدا بەشێوەیەکی شاراوە لە هەردوو شاری کابۆل و (مزار شریف) لە ئاکامدا بووە هۆی گەوزاندنی ژمارەیەکی زۆر لە هاونیشتیمانیە چەوساوەکانمان لە خوێنیان، و دانیشتنی خێزانەکانیان لەسەر خەم و پەژارەیەکی زۆر، وە بەڕاستی **ئیمارەتی ئیسلامی لە ساتەکانی یەکەمدا نکوڵی و ئیدانەی ئەم دوو ڕووداوەی کرد بە بەهێزی و جدییەوە**".

"دوێنێ ١٥-١- ١٤٣٣ هـ ئەنجومەنی شورای سەرکردایەتی ئیمارەتی ئەفغانستانی ئیسلامی دانیشتنێکی بەپەلەی بەست لەم بارەیەوە و تەوەرە گشتگیرەکان دەربارەی ئەم دوو ڕووداوە باسکرا لەم دانیشتنەدا، وە ئەم ڕەفتارەیان بە پیلانگێڕییێکی نەخشە بۆکێشراو لەلایەن دوژمنی شکستخواردوو لە قەڵەم دا، وە پێداگری کرا لەسەر ئەوەی پێویستە گەلی هۆشیارمان وریا بێت بە زیرەکییێکی زۆر لە بەرامبەر نموونەی ئەم کار و ڕەفتارانە لە لایەن دوژمن، **وە ڕێگە بە کەس نەدەن دوژمنایەتی و ڕق و کینە و کێشە بخاتە نێو گەلە یەکگرتووەکەمان بەناوی مەزهەبەوە**، یان هۆز و تیرەوە یان زمانەوە یان ناوچەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجە شووم هێن و خراپەکانیان.

"هەروەك ئەنجومەنەكە داوای لە هەموو لایەنە سیاسی **و مەزهەبییەكان** كرد لە وڵاتەكە كە لە كاتی ڕوودانـی نموونەی ئەم قەیران و كێشانەدا، **بەرژەوەندییەكانی گەل و نیشتیمان** پێشبخەن بەسەر بەرژەوەندیە تـایبەتی و حیزبییەكان، وە پێویسـتە لەسـەریان لێـدوانێك نەدەن بـۆ هێنـانەدی ئامـانجە سیاسـیەكانیان كە بە نیسـبەت یەكگرتوویی گەلەكەمان وەك پرژاندنی سووتەمەنی بێت بەسەر ئەو ئاگرەی دوژمـن دەیكـاتەوە، هەروەهـا لە دانیشتنەكە باس لەمەكرا كە دوژمن لە نموونەی ئەم ساتە هەستیارانەدا و لەسەر لێواری هەڵاتن وەك نەریتە خراپ و گەمژانەكەی دەستی درێژ دەكات بۆ ڕووداوەكانی وەك ڕۆژی عاشـورای خەمنـاك، وە هەوڵـدەدات تۆوی دووڕوویی و لێكترازان لە نێو گەلی ئەفغانی یەكگرتوو بچێنێت و پەرتەوازەیان بكات؛ چـونكە دوژمـن شكستی هێناوە لە هەموو فڕوفێڵ و پیلانگێڕییەكانی، بۆیە ئێستا دەیەوێت بە بەكارهێنانی ئەم خەنـجەرە تـۆڵە بسـێنێتەوە بـۆ هەمـوو شكسـت و بەزینەكـانی لە گەلە سـتەملێكراو و هەژارەكـەمان، بەڵام گەلە بەئاگـا و یەكگرتووەكەمان سینەی تەنگ نابێت و هەڵناچێت، هەرگیز بە نموونەی ئەم كارە تەڵەكەبازیانەی دوژمن، وە تەڵەكەبازییەكەی شكست دێنێت وەك هەموو تەڵەكەبازی و پیلانگێڕیەكانی تری، وە لە كۆتایی دانیشتنەكە و تاوتوێ كردنی دوو ڕووداوەكە لە هەموو لایەنەكانیەوە ئەم بەیاننامەیە دەرچوێنرا لەم خاڵانەدا:

١) **بەڕاسـتی ئیمارەتـی ئیسـلامی پرسـە و سەرەخۆشـی دەكـات لە كەسـوكاری هەمـوو قوربانیـان و زیانبەركەوتووەكان لەم دوو ڕووداوەدا، وە جـارێكی تـر بە تونـدی ئیـدانەی نمـوونەی ئەم جـۆرە ڕووداوانە دەكات.**

٢) **ئیمارەتی ئیسلامی نموونەی ئەم ڕووداوانە لە كار و تەڵەكەبازی داگیركەران و دوژمنانی ئەفغانستان لە قەڵەم دەدات، وە هەمـوو هاونیشـتیمانیان** بانـگ دەكـات بـۆ هەڵسـان بە بەرپرسـیاریەتیە ئیسـلامییەكەیان و لە پاشـان نەتەوەییەكەیـان و هاریكـاری كردنـی یەكـتر بـۆ ڕووبەڕووبـوونەوەی نموونەی ئەم ڕووداوانە چونكە كارەكانی دوژمن لە نموونەی وەك ئەمە دژ بە هەموو هاونیشـتیمانیانە و زیان دەگەیەنێت بە ئەفغانستانی سۆزدار.

٣) **ئیمارەتی ئیسلامی بەشێوەیەكی تایبەت داوا لە زانایان و سەرانی ئەهلی شیعە دەكات** لە ئەفغانستان كە تەواو وریابن لە بەرامبەر ئەوەی دەگوزەرێت و پێویستە گەلەكانیان بەم ڕاستییە ئاشـنا بـكەن كە ئەمە بابەتی دوژمنایەتی نێوان ئەهلی سوننە و شـیعە نیـیە هەرگیـز، وە پێویسـتە گـوێنەگرن بـۆ وتەی نابەرپرسـانەی هەنـدێك لە بەكرێگیـراوە ناوەخۆییەكـان ئەوانەی بـۆیەیەكی نـاكۆكی مەزهەبـی و نێوەخۆیی لەم كارە دەدەن بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیە تایبەتییەكانیان و ڕازیكردنی گەورەكانیان".

٤) ئیمارەتی ئیسلامی هەموو موجاهیدەكانی ڕێنمونی دەكات لە پاڵ بەرپرسیاریەتی و كـاری ڕاسـپێردراو پێیان بەوەی بە جدی گرنگی بدەن بە **قەدەغەكردنی ڕوودانی ئەم جۆرە كارە ناشرینانە**" [تقریر عـن

الجلسة الطارئة لمجلس الشورى القيادي لإمارة أفغانستان والبيان الصادر منها حول الهجومين في يوم عاشوراء في كابل ومزار].

"ئیبارەت" دەڵێت:

"**پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانان** ببنە بەربەست لە بەرامبەر هەموو تەڵەکەبازی خراپی دوژمنی فێڵباز، وە هیچ دەرفەتێکی پێنەدەن تاوەکو ئاگری ناکۆکی و دووبەرەکی بخاتەوە لە نێوان موسڵمانان.

بەشێکی گەورە لە سیاسەتی ئەمریکا لە عێراق **ئەوەیە کە موسڵمانان پۆلێن بکات بەناوی ئەهلی شیعە و ئەهلی سوننە**، وە لە ئەفغانستان بەناوی بشتون، و تاجیك، و هەزارە، و ئۆزبەك، تاوەکو توندی و بەهێزی ڕاپەڕینە گەلی و بەرهەڵستکردنە چەکدارییەکان لە بەرامبەر خۆیدا کەم بکاتەوە. [...] **بە هەمان شێوە من تکام لە برا عێراقییەکانە کە ناکۆکییەکان وازلێبێنن بەناوی ئەهلی شیعە، و ئەهلی سوننەو بیخەنە دواوە، وە یەکگرتووانە هەڵسن دژ بە دوژمنی داگیرکار، چونکە سەرکەوتن نایەت بەبێ یەکگرتن**" [رسالة إلى الشعب الأفغاني والعراقي المجاهدين].

وە پەیامنێری پشت پێبەستراو لەلای لیژنەی ڕاگەیاندنی "ئیبارەت" دەڵێت:

"شیعە بە موسڵمانیان دەزانین هەروەك خەواریج و زیادەڕەوەکان و ڕەوشت نزمەکانیان بەهەمان شێوە بە موسڵمان دەزانین. [...] هەر کەسێك شایەدی بدات بە (لا الە إلا الله ومحمد رسول الله) ئەوا موسڵمانە. چەندین فیرقە هەن و الله جیایان دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەت و بڕیاری خۆی لەسەریان دەدات" [تغريدات عبد الله الوزير].

لێرەدا هاتینە کۆتایی، وصلى الله على نبيِّنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

وەرگێڕانی **پێگەی ڕاستەڕێ**